جیرۆك

# كۆچ





نووسینی/ عبدالملك القاسم

وەرگێرانی/ ئارام عزیز

هەولێر/ ١٩٩٤

# کۆچ

چەند چیرۆکێکی کورتە

نووسینی: عبدالملك قاسم

وەرگێرانی: ئارام عزیز

# کۆچ

پرسـیـم لە هـەوار کـوانـێ دۆسـتـانـم
کـوانـێ ئاشـنـاو خۆشـەویستـانـم
گـوتـی چەنـد رۆژێ لێرە مانـەوە
ئێسـتاش رۆیشـتن نـەگـەڕانـەوە
گـوتـم لـە کـوێـنـە کـارم پێیـانـە
کامـە مەنـزڵگـاو جێگـە وڕێیانـە
گـوتـی ئێـسـتـاکـە میـوانـی گـۆڕن
لـە چاکەو خراپەی خـۆیان دەنوێن

نورەی خوشکم رەنـگ زەردو لاواز دەبــوو.. بەڵام هەروەك و جاران لەسەر قورئان خوێندنەکەی بەردەوام بوو..

هەر بزری بکە لەسەر بەرماڵەکە دەیدۆزی‌یەوە.. لە کرنۆش و سوژدەو دەست بەرزکـردنەوەیە بۆ ئاسمان.. بەیانی و ئێوارەو نیوەی شەو بەبێ ماندوو بوون و بێزاری ئاوات دەدیت..

ئەمنیش هەر خەریکی خوێندنەوەی گۆڤاری هونەری بووم کە شێوەی چیرۆکی هەبـوو.. بە زۆریش تەماشای ڤیدیۆم دەکرد تا وای لێ هاتبوو ناوبانگم بەوە دەرکردبوو.. ئەوەش هەبوو ئەرکەکانی سەرشانم جێبەجێ نەدەکـردن و نوێژکانم رێك و پێك نەبوون.. لە دوای ئەوە سێ سەعاتی لەســەریـەك فلیمی جۆراو جۆرم بینی ڤـیـدیـۆکەم داخست.. ئەوەتا لە مزگەوتەکەی تەنیشتمان دەنگی بانگ بەرزبۆوە..

★ گەڕامەوە جێگە نووستنی خۆم..
لەسەر بەرماڵەکەی بانگی کردم.. بەڵێ نورە چیت دەوێ؟
بە دەنگێکی توند گووتی: ئەخەوێ پێش ئەوەی نوێژی بەیانیت بکەی..
ئۆی.. هێشتا سەعاتێکی ماوە بۆ نوێژی بەیانی.. ئەوەی گوێم لێبوو ئەوە بانگی یەکەم بوو..
بەدەنگە بەسۆزەکەی بانگی کردم هەنا گیان وەرە تەنیشتم ـ هەربەو جۆرەبوو لە پێش ئەوەش تووشی ئەوتەخۆشییە چەپەڵە بێت و بکەوێتە ناو جێگە..

هەرگیز ناتوانم داوا کاریەکەی جێبەجێ نەکەم.. هەست بەپاکی و ڕاستگۆیی دەکەی.. چیت دەوێ..
دانیشە..
ئەوەتا دانیشتم چیت هەیە ...
بەدەنگێکی سازگارەو: (كل نفس ذائقة الموت وانما توفون اجوركم يوم القيامة)
«هەموو کەسێک تامی مردن دەچێژێ لە ڕۆژی قیامەت بەرهەمی دەستی خۆتان وەردەگرنەوە» تۆزێك وەستا.. پاشان لێی پرسیم..
بڕوات بەمردن نیە؟
بەڵێ بڕوام هەیە..
بڕوات بەوە هەیە کەلەسەر هەموو گچکەو گەورەیەك حیسابت لەگەڵ دا دەکرێ.. بەڵێ.. بەڵام خوای گەورە «غفورو رەحیمە».. هێشتا زۆرمان ماوە.. خوشکی خۆم.. لە مردنی کت و پڕ ناترسی..
بڕوانە هند لە تۆش بچوکتربوو بەڕووداری ئۆتۆمبیل مرد.. فلان و فیسکەو.. مردن لە تەمەن ناپرسی.. تەمەن پێوەری مردن نیە..
بەدەنگێکی بەترسەوە وەڵامم دایەوە لەکاتێکدا جێ نوێژەکەی تاریك بوو

ئەمن لە تاریکـایی دەترسێم.. تۆش بە مردنم دەترسێنی.. ئێستا چۆن بخـەوم.. وام دەزانی لە پشـووی ئەمسـاڵ رازی دەبی لە گەڵمـانـدا سەفەربکەی، یەکسەر دەنگی گۆڕا.. دڵم داخورپا..

لەوانەیە ئەو ساڵە سەفەرێکی دوور بکەم.. بۆ شوێنێکی تر.. لەوانەیە هەنا گیان لەوانەیە.. تەمەنیش بەدەستی خوایە.. دایە پرمەی گریان..

بیرم لە نەخـۆشی یـە خراپـەکـەی کردەوە.. پزیشکـەکان بەنهێنی بە باوکمیـان گوتبوو کەلەوانەیە ئەو نەخۆشیە نەهێلی زۆر بژی.. بەڵام کێ ئەوەی پێ گوتووە.. یان خۆی پێش بینی ئەوەی کردوە..

بیر لەچی دەکەیتەوە؟ ئەو جارەیان بەدەنگێکی بەرز پێ ی گوتم ..

- ئایا وا دەزانی بۆیە ئەو قسانە دەکەم چونکە نەخۆشم؟ نەخێر.. لەوانەیە تەمەنم لە ساغەکان درێژ تر بێ..

تۆش هەتـا کوکـەی دەژی.. لەوانەیە بیست ساڵی تر.. یان چلّی تر.. پاشان.. دەستی بەهێز چولاندەوەی لە تاریکی دا دیاربوو..

هەمووومان ئەو دونیایە بەجێ دێلین.. یان بۆ بەهەشتە وەیا بۆ ئاگر.. گوێت لە گووتەی شیرینی خوانە بووە (فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز)؟

«ئەوەی لە ئاگر دووركەوێتەوە و بچێتە بەهەشت ئەوە براوەیە»

خوا حافیزو شەوت شاد..

بەخێرایی رۆیشتم گوێم بەدەنگی دەزرینگایەوە.. خوا هیدایەت بدا.. نوێژ لە بیرنەکەی..

★ ئێستا هەشتی بەیانی یە..

گوێم لە دەنگی دەرگابوو.. ئەوەکاتی بە ئاگابوونم نیە. گریان.. دەنگە دەنگ.. خوای گەورە چی قەوماوە..

نوره حالی خراب بووه.. بۆ نەخۆشخانەیان برد.. اناللەو وانا الیه راجعون..

ئەوسـاڵ سەفـەرمـان نیـە.. ئەو ساڵەیان لەسەرم نوسراوە لەماڵەوە بمێنمەوە.. پاش چاوەڕوانیەکی زۆر..

سەعات یەکی نیوەڕۆ.. باوکم لە نەخۆشخانەوە تەلفۆنی کرد.. دەتوانن ئێستا سەری لێبدەن.. خێراکەن..

دایکم پێی راگەیاندم کە قسەکانی باوکم دڵنیاکەر نەبوون و دەنگیشی گۆرابـوو.. عەبـاکەم لە دەستم دابوو.. کوا سەیارەکەمان.. خێرا سوار بووین.. بۆچی ئەو رێگەیەی کاتی خۆی پیاسەم بە سەیارە پێدا دەکرت ئاوا کورت بوو.. کەچی ئێمرۆ درێژەو نابڕێتەوە.. کوا ئەو ئاپۆرە خەڵکەی کە هەر حەزم دەکـرد چەپ و راست بۆیان بڕوانم.. ئەو ئاپۆرەیە ئێمرۆ کوشندەو بێزاری‌یە..

دایکم لە تەنیشتمەوە دوعای بۆ دەکرد.. کچێکی چاك و گوێڕیەڵە.. هەرگیز نەمبینیوە کاتی خۆی بەفیرۆبدات..

لە دەرگـای دەرەوەی نەخـۆشـخـانە چووینە ژووری.. ئەو نەخۆشە دەنـالێنی.. ئەوەیان بەرووداوی سەیارە بریندارە.. سێیەمیان چاوی لە مۆڵەق وەستاوە.. نازانی ئەهلی ئەم دونیایەیان هی ئاخیرەتە.. دیمەنێکی سەیر لە پێشتر نەمبینی بوو..

بەخێرایی بە پلیکانەکان سەرکەوتین..

نوره لە زووری (العنـایة المرکزة) بوو.. پاشان ئەو کچە برین پێچە گەیشت کچێکی چاك بوو دایکی دڵنیا کردەوە کە لە دوای لە هۆش خۆ چوونەکەی ئێستا بەرەو چاکی‌یە..

تەنها یەك کەس دەتوانێ سەری لێدا..

ئەوە ژووری (العنایة المرکزة)یە

لەناو ئاپۆرەی دکتۆرەکان و لە پەنجەرە بچکۆلانەکەوە چاوەکانی نورەی خوشکم دەبینی دەیروانییە من و دایکم کە لە تەنیشتی بوو.. پاش دوو دەقیقە دایکم دەرچوو نەیتوانی فرمێسکەکانی بشارێتەوە..

رێگەی نیشیان دا بچمە ژوورەوە سەلامی لێبکەم بەو مەرجەی زۆر قسەی لەگەڵ دا نەکەم.. دوو دەقیقە بۆ تۆ بەسە..

نورە گیان چۆنی..

دوێنی ئێوارە خۆتۆ چاك بوویت.. بۆ وات لێهات..

دەستی گوشیم وەلامی دامەوە: سوپاسم بۆ خوا گەلێك چاکم.. سوپاس بۆ خوا بەلام دەستەکانت ساردن..

لەسەر رۆخی قەرەوێلەکە دانیشتبووم.. لاقی پێم کەوت و.. دووری خستەوە.. بە داخەوە ئەگەر ئەزیەتم دابێت.. نەخێر بەلام بیرم لە گوتەی خوای گەورە دەکردەوە (والتفت الساق بالساق الیٰ ربك یومئذ المساق) هەنا گیان دوعام بۆ بکە لەوانەیە لەو زوانە ئاخیری ژیانم بێ..

سەفەرەکەم دوورەو زادم کەمە.

کە گوێم لە قسەکانی بوو فرمێسکێك لە چاوەکانم هاتە خوارەوەو گریام.. نەم زانی لە کوێم.. لەسەر گریان بەردەوام بووم.. باوکم وای لێهات لەمن زیاترە دەترسا نەك لە نورە.. ئەو جۆرە گریان و خولە ژوور نانەی من لەلایان عادەتی نەبوو..

لەگەڵ رۆژئاوا بوونی ئەو رۆژە پڕ لە خەمە..

ماڵەکەمان بێدەنگی باڵی بەسەر داکێشا..

کچە خاڵ و.. مام و هاتنە لام لە ژوورەوە..

رووداوەکان خێرا بوون.

ئەوانەی دەهاتن زۆر دەبوون.. دەنگەکان تێکەڵ بەیەکتری دەبون.

لەیەك شت گەیشتم.. نورە مردووە.. نەم دەتوانی ئەوانەی دەهاتن لێکیان بکەمەوە.. نازانم چیان دەگوت..

خوادیـــە.. ئەمن لە کوێم چی رووی داوە.. هەتـا وەك و نەم دەتـوانی بگرییم.. پاشان پێیان گوتم باوکم دەستی راکێشابووم بۆ ماڵ ئاوابی یەکجاری نورەی خوشکم.. ئەمنیش ماچم کردبوو.. تەنها یەك شتم وەبیر دێتـەوە.. ئەو کاتـەی کە سەیـرم دەکـرد کەلەســەر نوێنی مردن بوو.. فەرمـوودەی خوام وەبیر کەوتەوە «والتقت الساق بالساق» ئەو راستیەم زانی کەوا «الیٰ ربك یومئذٍ المساق» واتە راپێچیانە بۆ بەردەم خوای گەورە)

تەنیا ئەو شەوەیان تێگەیشتم من گەرابمەوە جێگە نوێژی نورە..

ئەوکـاتــە وەبیرم هاتەوە کە کێ هاوبەشم بووە لەسکی دایکم چونکە جمکە بووین.. وەبیرم هاتەوە کێ بەشداری خەمم بوو.. وەبیرم هاتەوە کێ ناخـۆشی لەســەر لادەبــردم.. کێ دوعــای هیـدایەتی بۆ دەکردم.. کێ فرمێسکی بۆ دەرشتم و باسی مردن و حیسابی بۆ دەکردم.. هەر خوا یاریدەدەرە..

ئەوە یەکەم شەوێەتی لە گۆرەکەیدا.. خوای گەورە روحم بەنورە بکەی لە گۆرەکـەی دا.. ئەوەتانێ قورئانەکەی.. ئەوە بەرماڵەکەیەتی.. ئەوە.. ئەوە.. ئەوەتە فستانە سوورەکەی کە هەموو جار دەیگووت بۆ کاتی شوو کردنی هەڵیگـرتــووە.. وەبـیرم هاتــەوە و گریـام بۆ رۆژانی رابــردوو.. بەبەردەوامی گریام.. لە خوا پارامەوە روحمم پێ بکا تۆبەم لێ قبوڵ بکاو لێم خۆش بێ.. لەخـوا پارامەوە لە گۆرەکەی داسابتی بکاو.. کە خۆی حەزی لە دوعــایــە بوو.. لەنکـاوێـك لە خۆم پرسی ئەگــەر من بوومایەو بمــردمــایــە؟ چارەنـوسم چی دەبـوو..؟ لەو ترســەی دووچـاری بووم لەوەلامەکەی نەگەرام.. بەتوندی گریام..

الله‌اكبــر.. الله‌اكبر.. ئه‌وه‌ تا نوێژی به‌یانی‌یه‌.. به‌ڵام ئه‌و چارمیان چه‌ند خۆش و به‌سۆزه‌..

چه‌نده‌ هه‌ستم به‌ دڵنیایی‌و خۆشی كرد كه‌ وه‌ڵامی بانگه‌كه‌م ده‌دایه‌وه‌.. خۆم پێچایه‌وه‌و نوێژی به‌یانیم كرد.. نوێژی ماڵ ئاوایم كرد.. هه‌روه‌ك و خوشكم له‌ پێشدا كردی‌و كه‌ دوا نوێژی بوو..

ئه‌گه‌ر به‌یانیت كرده‌وه‌ چاوه‌ ڕێی ئێواره‌ مه‌به‌
ئه‌گه‌ر ئێوارەت كرده‌وه‌ چاوه‌ڕێی به‌یانی مه‌به‌



# دیاری

**عەمرو کوڕی قەیس دەڵێ:**
**ئەگەر چاکەیەکت هاتە رێ بیکە، ئەگەر جارێکیش بێت، ئەوە دەبیە ئەهلی چاکە خوازان...**

لە پاش ماندووبوونێکی زۆر خوێندنی پەیمانگای تەندروستیم تەواو کرد.. لە خوێندن دا جددی نەبووم.. بەڵام خوای گەورە کارەکەی بۆ ئاسان کردم و دەرچووم..

لە نەخۆشخانەیەکی نزیك شارەکەی خۆمان دامەزرام.. سوپاس بۆ خوا کارەکەم چاك بوو لە دایك و باوکیشم نزیك بووم..
بڕیارم دا پارە بۆ ژن هێنانم کۆبکەمەوە.. دایکشیم هەمیشە لەسەر ئەوە هانی دەدام.. کارەکە بە شێوەیەکی جددیو رێك و پێك دەڕۆیشت.. بەتایبەتی کارەکەی من کە لە نەخۆشخانەی سەربازی بوو..

چونکە بە خۆم حەزم لە جولانەوەو چوستی یە بۆیە لە کارەکەم دا زۆر سەرکەوتوو بووم ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ کاتی خوێندم دا کە تیوری یربێزاری بوو..

نەخۆشخانەکە کارمەندی جۆراو جۆری لە رەگەزدا تێدا بوو.. پەیوەندییم پێیان تەنها پەیوەندی کارەکە بوو.. هەروەها لە بەرئەوەی خەڵکی وولاتەکە بووم سودمەندبووم بۆیان... ئەمن رێ پیشاندەریان بووم بۆ شوێنە ئەسەریەکان و.. بازارو.. هەروەك بریکاییانم دەبردە باخچەکەی خۆمان.. پەیوەندیم لەگەڵیان بەهێز بوو وەك و عادەت.. هەر

کارمەندێکی بیانی کە کارەکەی کۆتایی دەهات.. ئاهەنگێکی ماڵ ئاواییمان بۆ ساز دەکرد..

ڕۆژێکیـان دکتـۆرێکی بەریتانی بڕیاری سەفەری دا بۆ وولاتەکەی خۆی چونکــە کارەکــەی تەواو بووبــوو پرس و و رامــان کرد بۆ ئەوەی ئاهەنگێکی ماڵ ئاوایی بۆ بگێڕین.. شوێنی دیاری کراویش باخچەکەی ئێمە بوو.. پاشان ڕێکمان خست... بەڵام ئەوەی بیرم لێ دەگردەوە.. چ دیاریەکی پێش کەش بکەم.. بەتایبەتی من ماوەیەکی زۆر لەگەڵی دا کارم دەکـرد.. لە هەمان کات دا دیاریەکی بەنرخ و گونجاوم دۆزیەوە.. ئەو دکتۆرە حەزی لە کۆکردنەوەی پارچەی ئەسەریە.. بەبێ ماندوو بوون و شەکەتی.. باوکم ئەو پارچانەی زۆر بوو.. داوام لێکرد.. پارچەیەکەم لێ وەرگـرت لە کۆنەوە لە ناوچەکەی خۆمان دروست کرابوو ئامۆزایەکم لەو گفتوگۆیەی من و باوکم ئامادەبوو..

ئەویش گوتی: بۆچی کتابێکی لەسەر ئیسلام بە دیاری بۆ نابەی.. پارچە ئەسەریەکم بردو قسەکەی ئامۆزکەم بە جددی وەرنەگرت.. بەڵام خوا بەبێ ماندوو بوون کارەکەی بۆ ئاسان کردم.. بەیانی چووم ڕۆژنامەو گۆڤـار لە کتێبخـانە بکڕم.. کتێبێکم لە سەر ئیسلام بەزمانی ئینگلیزی بەرچاو کەوت..

قسەکانی ئامۆزاکەم لە گوێ دا زینگایەوە.. بیری کڕینیم کەوتە سەر بەتایبەتی نرخەکەی گەلی هەرزان بوو.. کتابکەم کڕی.. ڕۆژی ئاهەنگی ئەو برادەرمان.. کتابەکەم خستە ناو پارچە ئەسەیەکەوە وەك و ئەوەی بیشنـێرمـەوە.. دیـاری خۆم پێشکـەش کرد.. ئاهەنگێکی ماڵ ئاوایی بە تەئسیربوو.. ئەو دکتۆرە لای هەمووان خۆشەویست بوو.. ئەو برادەرمان سەفـەری کرد.. ڕۆژو مـانـگ بەخـێرایی هاتن و ڕۆیشتن.. ژنم هێنـاو منداڵێکمان بوو..

ڕۆژێکیان نامەیەکم لە بەریتانیاوە پێگەیشت.. نامەکە بە زمانی ئینگلیزی بوو لەسەر خۆ خوێندمەوە.. لە بڕێکی ناوەڕۆکەکەی گەیشتم.. لە بڕێکیشی نەگەیشتم.. تێگەیشتم ئەوە نامەی برادەرێکی کۆنە لەوانەیە لەگەڵمان دا کاری کردبێ.. بەبیرە خۆم هێنایەوە.. یەکەم جارە گوێم لەو ناوە دەبێ.. بەڵکو لە گوێم دا ئەو ناوە کە (ضیف الله) بوو نامۆ بوو..

نامەکەم داخست بەڵام نەمتوانی کەسێك وەبیر خۆم بهێنمەوە بەو ناوە.. نامەکەم کردەوە جارێکی تریش خوێندمەوە.. لە ووشەکانی وورد بوومەمەوە.. ئەوەش بەشێکە لەنامەکەی..

برای بەڕێزم «ضیف الله»

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

خوا ئیسلامی بۆ ئاسان کردم و لەسەر دەستی تۆ ڕێنمایی کردم.. هەرگیز برادەرایەتی تۆ لە بیر ناکەم.. دوعات بۆ دەکەم.. لە بیرتە لە کاتی سەفەرەکەم ئەو کتێبەتِ بە دیاری دامێ.. ڕۆژێکیان خوێندمەوەو زۆرتر پەرۆشی کردم بۆ ئەوەی زیاتر لە بارەی ئیسلام بزانم.. خواش یارمەتی دام لەسەر بەرگی ناونیشانی بڵاوکەوەی کتێبەکەم دیتەوە.. سوپاس بۆ خوا نوری ئیسلام لە دڵم دا تیشکی دا.. لە «جۆن»ەوە ناوم گۆڕا بە «ضیف الله» واتە بەناوی تۆ.. چونکە هەر تۆ لەدوای خوا چاکەیەکی زۆرت بەسەرمندا هەیە هەروەك و وێنەیەکت لە بڕوانامەی ئیسلام بوونی خۆمت بۆ ڕەوانە دەکەم هەروەها هەوڵی ئەوە دەدەم بێمە مەککە بۆ حەج کردن

برات لە ئیسلام دا «ضیف الله»

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

نامەکەم داخست بە خێرایی کردمەوە سەر لەنوێ خوێندمەوە.. ئەو نامەیە بە توندی رایهەژاندم.. چونکە لە هەر پیتێك لە پیتەکانی هەستم بە ڕاستگۆیی دەکرد.. زۆر گریام.. چۆن خوا هیدایەتی پیاوێکی لەسەر

دەستی من داو ئەمنیش حەقی ئەوم بەجێ نەهێناوە کتابێك نرخەکەی ناکاتە (٥٠٠ فلس) خوا پیاوێکی پێ هیدایەت داوە..
خەمبارو.. دڵخۆش بووم.

دڵخۆش بووم کە خوا ئەو پیاوەی بۆ ئیسلام رێنمایی کرد بەبێ ماندوو بوونی من زۆریش خەمبار بووم. ئەو ماوەیە ئەمن لەکوێ بووم کە ئەو هەموو گارمەندە لەگەڵ مندا کاریان دەکرد.. بۆ ئیسلام بانگم نەکردن.. ئەو دینەم پێ نەناساندن.

هەتا بە ووشە بە کێش بێ بۆ ئەوەی لە رۆژی قیامەت شایەتیم بۆبدا.. قسەی زۆرم بۆ کردن گاڵتەی زۆرم لەگەڵدا کردن بەڵام نەکەم و نە زۆر باسی ئیسلامم بۆ نەکردن.

خوای گەورە (ضیف الله)ی بۆ ئیسلامەتی رێنمایی کرد.. منیشی بۆ حیساب کردن لەگەڵ خۆدا بە ئاگا هێنایەوە رێنمایی کردم بۆ کەم و کورتیم لە بەجێ هێنانێ فەرمانەکانی.. چاکە بە هەند هەڵدەگرم ئەگەر کتابێکیش بیت تەنیا بە (١٠٠) فلس بێ.. تۆزێکم بیر کردەوە ئەگەر هەر موسلمانێك بە تەنیا کتابێك بکاتە دیاری بۆ ئەوانەی دەورووپشتی.. چی دەبێ.
بەڵام جارێکی تریش پەرێشان و دڵگران بوومەوە لەوەی کە خوێندمەوە.
هەندێ لەو راستیانەی کە لە بارەی ئەفریقیاوە نوسراوە ـ ١٣٩ ـ هەزار ـ ملیون دولاری ئەمریکی لە ئەمریکا کۆکراوەتەوە بۆ کاروباری کەنیسە.
ـ ٣٩٦٨١٠٠ مزگێنی دەری (مبشر) گاور لە هەمان ساڵدا ئامادەکراوە ـ ١١٢٥٦٤٤٠٠ دانە ئینجیل دابەشکراوە..
ـ ژمارەی دەزگا راو بۆ بیەکان و تەلفیزیۆنەکانی گاوری گەیشتۆتە (١٦٢٠) دەزگا.

ـ ئەو سەرژمێرانە لە گۆڤاری (المجلة الدولية لابحاث التنصير)ی ئەمریکی ژمارە (١) بەرگی ١١ ـ ١٩٨٧ ز وەرگیراوە.

پرسیم ئێمە لە کوێین..
ـ چەندان کەسی ناموسلمانمان لە ناوە..

چەندو.. چەند.. ئازار فرمێسکی لە پێشدایە.. بەڵام پرسیارم هەردەمێنێتەوە.
کوانی کار..
کوانی کار..



# ئاگادار کردنەوە

سیـمـای جەنـازە زۆر ترسـنـاکـە
لەبـەر چاو وون بێ بەزمـی جارانـە
هێرشی گورگ چەنـدە سامـنـاکـە
بەڵام کەروێـشـت مەڕ لەومرانـە

لە قۆناخی خوێندنی بەراییم دا لە گەڵ باوکم ژیام..
دەوروبەرمکەم چاك بوو.. کاتی نیوەی شەوان دەگەڕامەوە ماڵەوە گوێم لە دەنگی پارانەوەی دایکم دەبوو..
گوێم لە دەنگی باوکم دەبوو خەریکی نوێژە درێژەکانی بوو.. زۆربەی جار سەرم سوڕدەما بۆ ئەوەندە درێژن.. بە تایبەتی لە چلەی زستان کە خەو خۆش دەبوو.
لە دڵی خۆم دا سەیرم پێ دەهات دەمگووت.. چەندە بە سەبرە .. هەموو رۆژێ.. شتێکی سەیرە.
ئەم دەزانی حەسـانـەوەو خۆشی ئیمـاندار لەوەدایە.. ئەوە نوێژی پیاو چاکانە.. لە شوێنە گەرم و گوڕەکانیان دێنە دەرەوە تا لەبەر خوا بپارێنەوە..
پاش ئەو قۆناخەی لە خوێندنی سەربازی بڕیم.. ئەوەتانی گەورە بووم و لە گەلیشیدا دووریم لە خوا زیاتر بووە..
لە گەل ئەو ئامۆژگاریانەش کە کاتە ناکاتێك گوێم لێ دەبن..
لە دوای دەرچوونم لە شارێکی تەواو دوور لە شارەکەی خۆمان دامەزرام..
بەڵام ناسینی هاوڕێ تازەکانم هەندێ ئازاری غەریباتی کەم کردەوە..

دەنگی قورئانم لە گوێچکە برا.. دەنگی دایکیشم برا کە هەموو جارێك بۆ نوێژ خەبەری دەکردمەوە و هانی دەدام.. بە تەنیا دەژیام.. دوور لە ژیانە خێزانیەی پێشترم..
دەست بەکاربووم لە چاوەدێری ڕێگایە خێراکان و.. دەورووبەری شار بۆ پارێزگاری ئاسایش و چاوەدێری ڕێگاو یارمەتی دانی لێقەوماوان.. کارەکەم نوێ بونەوەی تێدا بوو بۆیە لام خۆش بوو.. کارەکەم بە جددیو دڵسۆزی دەکرد..

بەڵام سەردەمێك کەوتمە ناوگێژاوی شەپۆلەکان..
نیگەرانی لە هەموو لایەك ڕووی تێ کردم.. فەراغم زۆر بوو.. ناسیارم کەم بوو.. هەستم بە بێزاری دەکرد.. کەسێ نەبوو لەسەر دینەکەم پشتم بگرێ.. بەڵکو بە پێچەوانەوە بوو..
ئەو دیمەنانە لە ژیانم دا زۆر جار دووبارە دەبوونەوەوە کارەسات و ڕووداوی بریندار بوون بەڵام ڕۆژێك جیا لە ڕۆژەکانی تر...
لە کاتی کارەکەمان من و هاورێکەم لە تەنیشتی ڕێگەوە وەستابووین.. کەوتبوینە گفتوگۆ.. لەنکاوێك گوێمان لە دەنگێکی گەورە بوو.
ڕوومان وەرسوڕاند.. دوو ئۆتۆمبێل لە بەرامبەر یەکتری هاتوون و لێکیان داوە.. بە خێرایی گەیشتینە ڕووداوەکە بۆ ڕزگارکردنی بریندارەکان ڕووداوێك هەرگیز وەسفی ناکرێ.. دوو کەس لەناو ئۆتۆمبێلەکە لە حاڵەتێکی ترسناك دابوون.. لە ئۆتۆمبێلەکەمان دەرهێنان.. درێژمان کردن..
پاشان چوین شوفێرەکە دەربهێنین.. بەڵام گیانی دەرچوو بوو.. گەراینەوە لای دوانەکەی تر ئەوانیش لەسەر ڕوح دان بوون..
هاورێکەم شەهادەی پێ دەهێنان.
بڵێن لااله الا الله.. لا اله الا الله

بەڵام ئەوان گۆرانیـان دەگوت.. ئەو هەڵوێستە زۆری ترساندم.. بەڵام هاورێکەم بە پێچەوانەی من دیار بوو حالاتی مردنی زۆری دیتبوو..
هەر شەهـادەی بۆ دووبارە دەکردنەوە.. بێ دەنگ وەستام.. بێ جولەو چاوتروکان تەماشام دەکرد.. لە ژیانم دا هەڵوێستی ئاوام نەدیبوو.. بەڵکو پێشتر هەردنم بەو جۆرە نەدیبوو.. برادەرەکەم هەر خەریك بوو ووشەی شەهـادەی پێ دەگـوتنـەوە.. ئەوانیش هەر لەمـەر گۆرانی خۆیـان بەردەوامبوون.. بێ سوود بوو..
دەنگی گۆرانی گوتنەکە بەرە بەرە لە نزمی بوو.. یەکەمیان دەنگی برانەوی دیکەش لە دوای ئەودا... لە جولە کەوتن..

★ دونیایان بەجێ هێشت
بارمـان کردنـە ناو ئۆتۆمبێلەکە.. هاورێکەم بێ دەنگ بوو. بەو شێوەیە ماوەیەکمان بری..

دەنگی برادەرەکـەم ئەو بێ دەنگیـەی رەوانـدەوە.. باسی مردن و ئاخیر شەری بۆکردم.. مرۆیان ئاخیرەکەی بە چاکەوەیان بە خراپە کۆتایی دێ..
بە زۆریش ئەو کۆتـاییەی بەڵگەی کارەکانی مرۆڤە لە دونیادا. چیرۆکی زۆری بۆ گێرامەوە کە لە کتێبە ئیسلامیەکان نوسرابونەوە.. چۆن مرۆڤ بە گوێرەی رواڵەت و ناخی ناوەوەی کۆتایی پێ دێ.. رێگەی نەخۆشخانەمان بری بە باسی مەرگ و مردوان.. ئەو دیمەنەش کاتێك تەواو دەبوو و کاری خۆی دەکرد کە وەبیرم دەهاتەوە ئەوە تەرمی مردووە لە تەنیشتمانە..
لە مردن ترسام و پەندم لەم رووداوە وەرگرت.. ئەو رۆژەیان نوێژەکانم بە ترسەوە کرد.. بەڵام بەرە بەرە ئەو هەڵوێستەم لەبیر کرد..
گەرامەوە سەر بەزمی جارانم.. وەك و رووداوی ئەو دوو پیاوەم نەدیبێ..
بەڵام بە راستی وام لێهـات حەزم لە گۆرانی نەما.. وەك و جاران بۆی

پەرۆش نەبووم.. لەوانەشە ئەوە پەیوەندی بە گۆرانی گوتنی ئەو دوو پیاوە هەبێ کەلە گیان دان بوون..

★ لە رۆژە سەیرو سەمەرەکان..

پاش ماوەیەك کە شەش مانگ تێپەری.. رووداوێکی سەیر قەوما.. پیاوێك بە ئۆتـۆمبێلەکەی خۆی بە ئاسایی دەرۆیشت.. لە یەکێ لە تونەلەکانی بەرەو شار.. ئۆتۆمبێلەکەی پەنچەر بوو..

هاتـە خوارەوە.. تا پەنچـەری بکات.. لە پشتی ئۆتۆمبێلەکەی وەستا بۆ ئەوەی سپێرەکەی دابەزێنێ.. ئۆتۆمبێلێکی دی بە خێرایی تێپەری.. لە پشتەوە لێیدا.. کەوتە خوارەوەو بە توندی بریندار بوو.. من و هاورێیەکی ترم کە ئەوەی جاری یەکەمم نەبوو ئامادەبووین.. بە یەکەوە خستمانە ناو ئۆتۆمبێل و پەیوەندیمان بە نەخۆشخانە کرد..

لاوێك بوو تازە هەلدەهات.. لە روخساری دیاربوو پیاوێکی دیندارە..

کاتی هەڵمانگـرت گوێمان لێبوو هەر پسەپسی بوو.. لەبەر پەلە پەلیمان نەمزانی چی دەگووت.

بەڵام کاتێ خستمانە ناو ئۆتۆمبێل و رۆیشتین..

دەنگێکی تایبەتیمان هاتە بەرگوێ..

بە دەنگێکی بە سۆزو قورئانی دەخوێند.. سبحان الله وات دەزانی هەر بریندار یش نەبووە..

جل و بەرگی خوێناوی بوو.. ئێسکەکانی شکا بوون.. لەوە دەچوو بە پێری مەرگەوە بچێ..

★ بە دەنگێکی ناسك لەسەر قورئان خوێندنەکەی بەردەوام بوو..

لە ژیانی خۆم دا گوێم لەو شێوە خوێندنە نەبووبوو لە دڵی خۆ دا دەمگووت وەك و ئەو برادەرەی یەکەم جارم ووشەی شەهادەی پێ دەڵێمەوە.. وەك و دەڵێن پێشتر پسپۆریم لەو کارە پەیدا کردبوو..

ئەمن و هاورێکەم بۆ ئەو دەنگە پڕ سۆزە هەستمان لە خۆ بڕی بوو..
هەستم کرد موچڕکم پێ دادێو دڵم دا خورپێ..
لەنکاوێک.. ئەو دەنگە نەما.. ئاورێکی دواوەم دایەوە.. بینیم پەنجەی شایەتمانی بەرز کردۆتەوە.. پاشان ملی لار بۆوە..
بازم دا پشتەوە..
دەستم کردە دەستی..
دڵی..
هەناسەی..
هیچیان نییە
ماڵئاوایی لە ژیان کرد..
زۆری تێ رامام.. دڵۆپە فرمێسکێکم لە چاوان کەوتە خوارەوە لە هاورێکەم شاردەوە .. ئاورم لێ دایەوەو پێم گووت پیاوەکە مرد.. دەستی بە گریان کرد.. ئەمنیش هاوارم لێ هەستاو فرمێسکم بەگوڕ هاتنە خوارێ.. لەناو ئۆتۆمبێلەکە دیمەنێکی دڵتەزێنمان هەبوو..
گەیشتینە نەخۆشخانە..
ئەوەی گەیشتینێ چیرۆکی ئەو پیاوەمان بۆ گێرایەوە.. زۆرانیان ئەو رووداوە کاری لێ کردن و فرمێسکیان باراند.. یەکێکیان کە ئەو چیرۆکەی بیست چوو نێو چاوانی ماچ کرد..
خەڵکێکی زۆر مانەوەو چاوەڕێ بوون بزانن کەی نوێژی لەسەر دەکرێ تا ئەوانیش نوێژی لەسەربکەن..

فەرمانبەرێکی نەخۆشخانە پەیوەندی بە ماڵی مردووەکە کرد لە گەڵ برایەکی قسەی کرد.. دەربارەی گووتی.. داپیرێکی تەنیای لە گوندی هەبوو.. هەموو دووشەممان دەچووە سەر لێدانی.. سەری لە بێوەژن و هەتیوان و... هەژاران دەدا.. خەڵکی ئەو دێیە دەیانناسی کتێب وکاسێتی

ئیسلامی بۆ دەبردن. هەموو جارێ ئۆتۆمبێلەکەی پڕ برنج و شەکر دەکرد بەسەر هەژارانی دەبەخشیەوە.. هەتا شیرینی منالآنیشی لەبیر نەدەکرد تا وەك و کەیف خۆشیان بکا.. هەر کەسێ باسی ناخۆشی سەفرو درێژی رێگەی بۆ دەکرد.. دەیگوت سود لەو رێگەیە وەردەگرم قورئان لەبەردەکەم و پیای دەچمەوە.. گوێ لە کاسێت و دەرسی ئیسلامی دەگرم.. هەر هەنگاوێکی دەهاوێم چاوەڕێمە خوا بۆ خۆی حیسابی بکا..

بەیانی .. مزگەوت پڕ بوو لە نوێژکەر.. ئەمنیش لە گەڵ ئەو هەموو موسلمانە نوێژم لەسەر کرد.. لە دوای ئەوەی نوێژمان تەواو کرد بەرەو گۆڕستانمان برد.. خستمانە ئەو چاڵە تەنگە..

★ روویان لە قیبلە کرد..

بسم الله وعلى ملة رسول الله

خۆڵمان بەسەردا کرد..

داوای خۆراگری بۆ ئەو برایەتان بکەن.. ئێستا لێی دەپرسنەوە.. پێشوازی یەکەم رۆژی ئاخیرەتی کرد.. ئەمنیش وەك و پێشوازی یەکەم رۆژی دونیام کردبێ.. پەشیمان بوومەوەو تۆبەم کرد لەوەی کردبووم بەڵکو خوا لە رابردووم خۆش بێ‌و لەسەر گوێ رایەڵی پێم توند بکاو ئاخیرەتیشم بە چاکە کۆتایی بێنێ.. گۆڕی من و گۆڕی هەموو موسلمانێك بکاتە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشت.



# گەڕانەوە

**ئەگـەر بمـێنی ئەوە شیـوەنت لە بۆ دۆستـانـە**
**بەڵام خۆت بمری ئەوە بە راستی کوستێکی گرانە**

---

لە هۆش خۆی چوو وکەوتە سەر عەرزی...
ئەوە یەکـەم جاری نیـە... لەو دوو ساڵەی شووی کردوە دوو جاری شەکەتیەکی دەروونی بەردەوام بووە....
گوتیان پیاوێکی چاکەو... چاوە ڕێی خێری لێ دەکرێ.
تۆش دەتوانی کاری تێ بکەی بۆ ئەوەی کاروباری دینەکەی خۆی بزانێ...
نوێژەکانشی بە جەماعەت بکا.....
کچم تۆش... خوشکی بچوکت لە پێش تۆدا شووی کرد... پێم وایە ئەو پیاوە بۆتۆشیاو بێ....
دایکیشم لەسەری پێی داگرت.. حاڵی چاکەو.... لە خێزانیکی ناسراوە..
خاوەن پلەو پاییەکیوەزیفی بەرزە...
ئەو روخسارە بەبریق و باوانە لای من بایەخێکی نیە...
لەدینەکیم پرسی... ئەوەیە لای من گرنگە.. پیاوێکی چاکم دەوی لەسەر چاکەو بەگوێ کردنی خوای گەورە پشت بەستم بێ.. ئەگەر خۆشیویستم رێزم بگرێ ئەگەر رقیش لێم بوو بە جوانترین شێوە دەستم لێ بەردا..
چەندان چیرۆکی ناخۆشمان گوێ لێ دەبێ کە مێردەکان ستەمی دەکەن و گۆبەندیان بۆ ژنەکانیان نایەتەوە لەبەر بە درەوشتیو بێ دینی.
خەوم.. بە پیاوێك دەبینی لە نیوەی شەوا بۆ نوێژناگام کاتەوە..

لە تاریکی شەوان دا لەبەر خوا دەپارامەوەو فرمێسکم دەباراند کەسێکم بەنەسیب بێ لە گوێڕایەڵی خوادەستم بگرێو لەسەر ڕەزامەندی خوا لەگەڵیدا بژیم...

بە یەکەوە بەوەو خوا بڕۆین لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و یارەدلسۆزەکانی....
خەوم بە پیاوێ دەدی کە منداڵەکانی بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردەبکا...

دەهاتە بەر چاوەم واله دەرگا وەستاوم دەروانم ئەوە خۆی و کوڕەکەمن دەچنە مزگەوت....
لە خوا دەپارامەوە کە گوێم لە دەنگی هارسەرەکەم بێ و بڵێ:-

ئەو ڕۆکە چەندت قورئان لەبەر کردوە...
چەند جزمت خوێندۆتەوە.. خەوم بەوە دەبینی کە منداڵە کەم لە پێش کەعبە ڕاگـرتوەو بۆی دەپاڕێمەوە.. بامنالّم زۆربن مادام پاداشی تیایە.. کاتێك دونیا بەجێ دێلم هەنە کە خوا دەپەرستن و بەتاکی دەزانن.. زۆرم لەو خەونـانـە بینی.. گەلێك دڵی خۆم بەو خەونانە خۆش کرد... لەسەر هەر حالێك بێ سوپاسی خوا دەکەم.. لە پێناوی خوا سەبرم گرت.. لە بەرایی باش بوو نوێژەکانی دەکرد.. بەرە بەرە تەمبەڵی گرتی.....

جیت دەوێ.. خوا لێمان خۆش دەبێ بەخشندەو بەزەیی‌یە..
نوێژەکەم دەکەم... دەکەم....؟
هێشتا زووە...
کاتێك بۆ نوێژی جەماعەت هانم دەدا ئەو قسانەی دەکرد.. هەستم دەکرد لەگـەڵ سور بوون و توندیم باشتر دەبوو.. هەر ئەوەش بوو من پێی گەشبین بووم..

له برادەرە خراپەکانی دەترسام باسی هەندێکیانی بۆ کرد بووم.. دەترسام ئەوان کاری تێ بکەن.. بیرم لەرێگە چارەیەك کردەوە کەلەوانەیە چاکتربێ لە ئامـۆژگـایـەکـانم.. بۆچی بە گەنجێکی موسلمـانی چاکی نەناسێنم بەلکوکاری تێ بکا....

هاوسەری دەستە خوشکێ‌ێم دکتۆرێکی گەنج و موسلمانێکی رێك و پێك بوو...
بەخێرایی تەلەفونم بۆ کرد.. دەستە خوشکەکەم بیرۆکە کەی پێ چاك بوو هانی پیـاوەکەی خۆیدا.. پێم گووت ئەوە فلانە کەسە لەگەڵ پیاوەکەی دێنەلامان.. هاتن...
گەلێك دلخوش بووم... بەڵکو خوای گەورە خۆشە وستی ئەو کورەی بخاتە دڵی.. هەر چەندە میوانداریەکە زیاتری دەخایاند من زیاتر ولم خۆش دەبوو...
★ هەر لە دەرگا خوا خافیزم لە دەستە خوشکە کەم کردو....
بە خێرایی گەرامەوە....
دانیشتم پەنجەکانی خۆم دەگوشین.. چاوەرێمە قسەیەك بکا...
ڕوانیمە چاوەکانی...

گووتی... پیاوێکی چاك و ڕەوشت بەرز بوو... بەلام هیچ حەماسەتێکم تێدانەدی بۆ سەر لێدانیان بەگوێرەی بەڵێنەکەی.. بە هەموو ڕێگاو هۆیەك .. هەولم دا نوێژەکانی لە مزگەوت بکات...
ئێستـاش لە پاش ئەوەی منـدالێکمـان بوو... زیـاتر سورم لەسەری.. چەندان شەو بە تەنها بووم.... ئەو لەگەڵ برادەرەکانی قاقای پێکە نینیان بوو ئەمن ومنالەکەشم دەگریاین.. زیاتر دەپارامەوە خوا هیدایەتی بدا....
بڕیارم دا شەو نوێژەکان لەژوورەکە مان دا بکەم هەر لە تەنیشتیەوە بەڵکو

ئەوە خوایەو دڵی زیند ووببێتەوە... جار جارێك بە ئاگا دەهات و دەیبینی نوێژ دەکەم... لە ڕۆژیش دا دیقەتم دەکرد نوێژەکانم کاری تێ کردووە...
ئێواری ئەو ڕۆژەیان خەبەری دامێ کە جل و بەرگی سەفەری بۆ ئامادە کەم دەچێتە فلانە شار بۆ کارێك.. ئەم دەمزانی ڕاست دەکا یان نا، زۆر جار سەفەری دەکرد بێ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە.. برێ جاریش پەیوەندی پێمان دەکردو ژمارەی ژوورەکەی و تەلەفۆنەکەی بەجێ دەهێشت.. ئەگەر منیش پەیوەندیم پێوە بکردایە دەمزانی لە کوێیە.. بەلام بە زۆری ئەم دەمزانی بۆ کوێ چووە.. بەلام انشاء الله گومانی باشە بە موسلمان دەبەم....

لەماوەی سەفەرەکەی هەر دوعام بۆ دەکرد.. ڕۆژێك لە دوای سەفەری تەلەفۆنی بۆ کردم و ژمارە کەی دامێ... سوپاس بۆ خوا لەوە دلێنابووم کەلە وولات نەچووە تە دەرێ...
ئینجا سێ ڕۆژان دەنگی بڕا..... لە ڕۆژی چوارەم
گوێم لە دەنگی بوو وەخت بوو نەینا سمەوە.... ئەوە چیتە انشاء الله ئەوشەو دەگەڕێمەوە... وەك وەندالێ دەگریا.. ئەمنیش دەستم کردە گریان بێ ئەوەی بزانم چی قەوماوە.. لە پاش ماوەیەك بێ دەنگی... تەماشایەکی کردم و فرێسك لە چاوەکانی ڕیزیان بە ستابوو...
دوا فرمێسکی سڕیەوە گووتی:ـ سبحان الله هاوڕێی ئیشم بوو..
★ بە یەکەوە سەفەرمان کرد بۆ برێ ئیش.. لە دوو ژووری تەنیشت یەك دەخەوتین یەك دیوار لەیەکی جیادەکردینەوە.. ئەو ئێوارەیان لەسەر یەك خوان یە یەکەوە نانمان خوارد.... گەلێکمان قسەکردوە.. گەلێك پێکەنین...
خەومان نەدەهات.. بەناو بازاڕی شاردا سوڕاینەوە.. دوو سەعات نەوەستاین.. چاوی خۆشمان لە حەرام نەدەپاراست...

پاشان لێك دابراین بەهیوای بە یەك گەیشتنەوەمان تاكو سبەی بەیانی كارەكانمان ڕاپەڕێنین....
بەچاكی خەوتم..سەعات حەوت و نیو نوێژی بەیانیم كرد....

بە تەلەفۆن پەیوەندیم پێ كرد تا بە ئاگای بێنم.. وەڵامی نەبوو.. جارێكی تر هەوڵم دا... لەوانەیەلە سەر ئاو بێ.. كوپەشیرێكم بۆ هاتبوو خواردمەوە.. جارێكی تر پەیوەندیم پێ كرد.. وەڵام نەبوو....

ئەوە سەعات هەشتە لە دەوام بەدوا كەوتین.. لە دەرگام دا.. وەڵام نەبوو... پەیوەندیم بە پرسگای ئوتێلەكە كرد لەوانەیە دەرچووبێ.. بەڵام لامیان دامەوە كە لە ژووری خۆیەتی..
چار نیە دەبێ ژوورەكە بكەینەوە بزانین چی بووە...

خەوتووە...
صالح... صالح..

جارێكی تر بانگم كرد..
هەر چەندەی لێ نزیك دەكەوتمەوە دەنگم بەرز دەكردەوە...
خەوتووە بەڵام زمانی خۆی گەستتۆە...
ڕەنگی گۆڕاوە....
زیاتری لێنزیك كەوتمەوە....
جولەی نەبوو....
ڕاپۆرتی پزیشكی دەڵێ:- لە دوێنێوە بەهۆی وەستانی دڵی لە نكاو مردووە.. كواتی ساخی.. كواهەڕەتیو.. گەنجی.. دوێنی بەیەكەوە پیاسەمان دەكرد خۆهیچی نەبوو... هەرگیز باسی نەخۆشی نەكردووە..
حیساباتی خۆم دووبارە كردەوە....

ئەوە مردنی لە نکاوە نازانین کەی دێت.... بەڵکو بێ پێشەکیە.... لە خۆمم پرسی بۆمن خۆم نەهێنمــە جێی صالح... چۆن بەرامبــەر خوای گەورە بوەستم.... کواکردەوەم.. چیم بۆ خوا کردووە.. هەرگیز هیچ.... زانیم کەم کورتیم بەرامبەر بەخوا گەڵی زۆرە....

مێردەکــەم بێ دەنــگ موو... کریــاو منیشی گریــاند.. بەیەکەوە کەلێك گریــاین.... سوپــاسی خوام کرد لەســەر ئەو ڕێ پێشاندان و ڕێنمایی کردنــە... لە پاش ئەوە ژیــانمان گۆڕا... ژیاین وەك و چۆن هەموو جار خەونم پێوە دەبینی بگرە زیاتریش...
لەحەفتەی دوای ئەو.....

سوپــاس هەول و مانــدوو بوونــی منی کرد کە چەنــدە حەریس بووم بۆڕێنمایی کردنی.. ئاگاداری کردمەوە دەچینە عەمرەو لاپەڕەیەکی تازەی خواپەرستی دەکەینەوە...

وەخت بوو لە خۆشیان بفرم.. لەوەتی شووم کردووە نەچوومە مەککە..
★ چەشتانەی ئەو ڕۆژە چووینە حەرەم.. خەڵکی کەم بوون.... ماوەی هادین قەرە بالغی نیە...

ئەوەی خەوم پێوە دەدیت خوای گەورە هێنا یەجێ....
بە خۆم و کورەکــەم لەبــەرامبەر کەعبە وەستاین.. بەڵام نەمتوانی هیچ دوعایەکی بۆ بکەم.... هەر گریام و هەرگریام.. تا نورمم لەبەر برا...
بەیانی انشاء الله تەواف مالئاوایی دەکەین و ئەو ئەرزە پیرۆزە بەجێ دێلین پاش تەواف ماڵئــاوایی... لە حەرەم گەڕاینــەوە بۆ ئەوەی خۆمان ئامادە بکــەین.... ئەوە چیت پێیە.... ئەوەیان کتابی این رجب (جامع العلوم والحکم)ە.. ئەوەیان کتابی (الوابل الصیب)ی ابن القیم.. ئەوی تر کتابی

(الجواب الكافى لمن سئل عن الدواء الشافى) ئەوەیان فوڕئانێکی بچوکە...
نابێ هەرگیز لە گیرفانم جیا بیتەوە....

★ خۆشەویستەکەم.....
ئەوە مەشخەڵی ڕێگەی ئاخیرە تمانە..
کاتێك جانتاکەی دەبەستایەوە دەیگوت:

«ربي أجعلني مقيم الصلاة ومن ذريتي ربنا وتقبل دعاء.... ربي اغفر لي ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب».



# پاڕانەوە

**ئەوەی دەمێنێ لە شۆخیو جوانی**
**لەنەماندایە**
**نەماڵ..... نەمنداڵ**
**هیچی نامێنێ**
**ئەوەی دەمێنی.. بە تەنیا خوایە**

ئەوە حەوت ساڵ دەبێ ژنم هێناوە....
سوپاس بۆ خوا ئەوەی دەمویست ـ پێم وایە ـ وەدەستم هێناوە....
لەکارەکەم رازیمە.. لەژن هێنانەکەشم قایلم..
ئەوەی من وخێزانەکەمی بێزارکردبوو مناڵمان نەدەبوو.... بێزاری دەستی پێ کرد..
گەلێک وکتۆرمان کردن...
لام وایە هەموو هەولێکم دا...
لە ناوەوەو دەرەوەی وولات..
کاتێک گوێم لێ دەبوو فلانە دکتۆر تایبەت بەنەزۆکی لە هەندە رانەوە هاتووە... بێ سێو دوو
کارتم دەبرێو... وەعدەکم وەردەگرت..
شێکردنەوەیەکی بێ شومارو دەرمانێکی زۆر تر....
★ بەلام بێ سود بوو....
لەگەڵ خێزارنەکەم هەرە زۆری قسەکانمان سەبارەت بەفلانە وکتۆرو..
چیگووت و.. چی لێ پێشبینی دەکەین....

ئەو پێشبینیانــە ساڵ و دوو ساڵی دەخایاند... قۆناخی چارەسەرکردن دوورو درێژ بوو....

هی وا هەبــوو هۆکـاری ئەزۆکیەکـەی بۆمن دەگێڕایەوە.... هەشبوون دەیانگووت لە ژنەکەمە...

بە هەر حاڵ...

ژیانمان ببووە گەڕان و سوڕان بە دوای چارەیەك.

بوونی منداڵێك هەموو هەستو نەستی داگیرکردبووین... لەگەڵ ئەوەش هەوڵم دەدا نەهێڵم خێزانەکەم ئەو هەستە بکا.. بەڵام چارنیە هەر هەست بەوە دەکا رووی دەدا....

پرسیار زۆر بوون...

هەبــوون پێیــان دەگــووت چاوە ڕێی چی دەکەی.. وەك و کارە کە بە دەستی خۆی بێ....

هەبوون ئامۆژگاریان دەکرد تا بچێتە لای فلانە دکتۆر...

فلانە ژن چووە لای و منالی بوو... فیسارە ژن..

نابەو چەشنە کۆمەڵگای خێزانەکەم گەلە پرسیارێکی زۆری بەنسیب بوو کەسێ نەیگووت...

بۆ روونەکەینە خواو بەرا ستگویی لێی بپارێینەوە...

حەوت ساڵ بەسەر چوو ئێمە هەر بەدوای داو دەرمان و دکتۆران ڕامان دەکرد.. وازمان لە پاڕانەوەو ڕووکردنە خوای گەورە هێنا بوو....

★ شەوێکیان...

لە ڕێگا دەهەڕیمەوە پیاوێکی کوێریشم بینی دەیویست بپەڕێتەوە.... دەستم گرت....

بەشی یەکــەمی ڕێگـاکەم پێ بڕی... لەناوە ڕاست وەستاین.. چاوە ڕێ بووین ئۆتۆمبێلەکان تێ پەڕن...

لە پاش ئەوەی دوعای بۆ کردم..
لەوەڵەدا لێی پرسیم....
ژنت هێناوە؟
گوتم بەڵێ...
پاشان گوتی
منداڵت هەیە...
گوتم: تائێستا خواقەدەری لەسەر نەبووە...
ئەوە حەوت ساڵە چاوە ڕێی ڕەحمەتی خواین....
لە ڕێگەکە پەڕینەوە....

لە دوای ئەوەی ویستم خوا حافیزی لێ بکەم پێی گوتم:
کوڕی خۆم ئەمنیش ڕۆژێ لە ڕۆژان دووچاری ئەو ڕووداوەی تۆببووم..
بەڵام لە هەموو نوێژێك دەپاڕامەوەو دەمگووت:
«رب لا تذرني فرداً وانت خير الوارثين».
سوپاس بۆ خوا ئێستا حەوت کوڕم هەیە ئینجا دەستی گوشیم و گوتی:
نزاو پاڕانەوە لەبیرنەکەی....
پێ ژیستی ئەو ئامۆژگاریانە بووم...
ئەوەی ونم کردبوو دۆزیمەوە...
سەربردەی ڕووداوم بۆ خێزانەکەم گێڕایەوە...
زۆرمان قسە کرد...
بۆ ئێمە بیرمان لە دوعاو پاڕانەوە نەکردەوە هەموو شتێ گەڕاین وتاقیمان کردەوە هەر دکتۆرێکی گوێمان لێ بوو لە دەرگامان دا...
★ بۆچی لە دەرگای خوای گەورەش نەدەین؟
لە هەموو دەراوزەیەك فەرەوانترو نزیکترە...
خێزانەکەم گووتەی پیرەژنێکی وەبیرکەوتبۆوە کە دوو ساڵ بەر لە ئێستا ئەو

ئامۆژگاریەی کرد بوو...
بەلام ئەوکاتە سەر قاڵی مەوعیدی وکتۆمکان بووین ..
چوونە لای دکتۆر ببووە شتێکی عادەتی....
بێ ماندوو بوون و شەکەتی...
بێ دوو دڵی و نیگەرانی...
سەرلێدانی ئاسایی
لە دوای تاکە چارمیەکی تایبەت دەگەراین...
کە هۆیەك بێت بۆ ئەو ئەنزۆکی یە....
لە ناخ و پڕ بەدڵەوە ڕوومان کردە خوا....
لە نوێژە فەرزەکان و لە نیوەی شەودا
لەو ساتانە گەراین کە دووعای تێدا قبوڵە
خواش بێ ئومێدی نەکردین و....
بێ وەرام نەبووین...
بەڵکو دەرگای وەرام دانەوەی بۆ خستینە سەر پشت...
خێزانەکەم سکی بوو...
منداڵێکمان بوو....
«تبارك الله احسن الخالقين.....»
گەلی شادو بەکەیف بووین...
ئێستاش دەڵێینەوە:
«ربنا هب لنا من ازواجنا وذرياتنا قره أعين وا جعلنا للمتقين أماماً».



# میسلە هەڵگر

**بە (عبد الله)ی، کوری [عمر]یان گووت:- فلانە کەسی ئەنساری مرد، گووتی:- رەحمەتی خوای لێ بێ گووتیان. سەد هەزاری جێ هێشتووە گووتی:- پارەکە ئەوی جێ نە هێشتووەو وازی لێ نەهێناوە.**

ڕوو بە ڕووی دەست کورتیو نەبوونیـەکی توند بۆوە حاڵی ڕوو لە خرابی بوو.. چی لە دەست نەما دۆستەکانی لێ تەکینەوە...

لە بیریـەتی دەســاڵ پێش ئیمڕۆ وازی لەدائیرەکەی هێناو.. دەستی کردەکاری سەربەخۆ... پاش وازهێنانی دائیرە ژیانی بەرەو چاکی بوو... سامانەکەی ڕوو لە زیادی بوو.. گواستیەوە خانوێکی گەورەی خۆش.. ژنێکی تریشی هێنا.... هەمیشە لەسەفەردا بوو.. کەوتە ناو حەرام وتەرام بەبێ حیسات... گوێی لە دەنگی بانگ دەبوو چونکە مەکتەبەکەی چەند مەترێك لە مزگەوت دوور بوو.. بۆ نوێژ نەدەچوو.. بەڵکو ماوەیەکی دوور ودرێژ سوژدەیەکی بۆ خوانە برد... کاری زۆرە ماوەی نیە..

لەمـاڵەوە ئاژەڵ ئاسـا... دەخـواو دەخـواتەوەو دەخەوێ... گوێی نەدەدایە پەروەردەی منداڵەکانی... ڕۆژێ نەیپرسی ئایا نوێژ دەزانن یان نا.. سامانەکەی حەلال و حەرامی وەك و یەك بوون... ڕێگەی پەیدا کردن گرنگ نیە ئەنجام و ئاکام گرنکە.. ئەوە بناخەیەکی بازرگانی‌یە.

★ بەڵام... لەو دوو ساڵەی دواییدا... بازرگـاینـەکەی ڕوو لە خرابی بوو... هەمـوو شتێکی ئەستـەمی دەکـرد تاوەك و کارو قازانجـەکانی

پێشووی بپارێزێ.. بۆیە کارەکەی بەرەو فەوزا بوو.. چۆن خنکاو لەناو ئاودا پەلی دەکوتی بۆ رزگار بوون.

ئەو کەسانەی لە دوای قازانجی خێرا دەگەڕان باسی ئەو پرۆژەیەو فلانە پرۆژەیـان بۆ دەکـردو پۆیان دەڕازاندەوە.. ئەو پرۆژەیە سەرنەکەوت... ئەوی تریان نیوەی پارەکەی خۆی نەهێنایەوە.... لە دوو ساڵ دا قەرزی زۆر بوو.... گێروگـرفتی زیادی کرد.. وەبیری هاتەوە پێش وازهێنانی لە دائیرە چۆن بوو.... ئێستا مەسرەف زۆر بووەو ئەوەی دێتە دەستی ڕوو لەکـەمیە.. دەستی کرد لە بانکەکان قەرزی وەردەگرت.. لەیەك ساڵ دا قەرزێکی زۆری لەسەر کوبوەوە نەیتوانی بیداتەوە... پێی نایەقوناغێکی تازە لە ژیانی.. قۆناخی دادگاو پۆیسیو لێ کۆڵینەوە... تەنها کاری ببووە ئەوە قەرزەکـانی بۆ کاتێکی تر دوا بخـا.. مانـگ رۆیشتن..... کاتی قەرزدانەوە هات.... سیمای بەندنجانە دەرکەوت.. جارێك بە هەڕەشەو ترساندن.. جارێکی تر بە شکات و سکالا.. ئەوە بوو قەرز دەرەکان دەیان کرد.....

ئەوەی هەیبوو هەمووی فرۆشت... خانوەکەی ئۆتۆمبێلەکانی زەوەیەکانی موڵکەکانی... زۆربەی دایەوە.....

هەندێ لە قەرزەکانی مایەوە بەڵام خاوەنەکانیان بەزەیییان پێ هاتووەو. وازیـان لێ هێنـا.. ماڵ و خێـزان و دە منداڵەکەی لە خانوویێکی بچوك خرکردەوە شوفێرو خزمەتکا نەما ـ شەوی بەخەم و پەژارە بەسەر دەبرد...

★ لە نێـو ئەو گێروگـرفتانە سەردانی برادەریکی هاتە خەیاڵ کە ناوی (محـمـد) بوو.. بەڵکـو یارمـەتیـەکی بدا.. ئەوە برادەری منالیەتی.. لە وەزیفەش بەیەکەوە بوون...

بڕوانە لای.. یان نەچێ.. لەگەڵ ئەوەش دا کە (محمد) پێش دوو ساڵ سەری لێ داو زۆر دڵتەنگ بوو بەو ڕواڵەت و روخسارە بە بریق باوەکەی و

دەنگی موسیقای ناو ماڵەکەی.. بەڵام چی بکا لەگەڵ پێ ویستی....
کاتێکی گونجـاوی هەڵبـژارد.. کاتی عەسری سبەی.. لە دوای عەسردا جلەکانی لە بەرکرد......

یەکی لە جەرەسی دەرگای دا... کێیە...؟ «بڵێن لە ماڵەوە نی‌یە» ئەوە خاوەن خانوەکەیە کرێی دەوێ.. کوا باوکتان..؟ لەماڵێ نیە.. ناچار بوو نیو سەعات خۆی دوا نجا تا خاوەن خانووە کە دوور دەکەوێتەوە...

بەخێرایی لەماڵەوە دەرچوو سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو... بەرەو ماڵی (محمد) هەمـان ماڵەکەی پێشانی.. ئەگەر نەگۆرابێ.. یەکسەر دوای بانگی ئێوارە گەیشتە دەرگەیان.. کێیەلە دەرگا... ئەمن صالحم.. محمد لە کوێیـە.. چووە بۆ مزگـەوت دوای نوێـژ دەگـەرێتـەوە.. گەراوە ناو ئۆتۆمبێلەکەی... زۆر عەیبە لەناو ئۆتۆمبێل دانیشتیٚ‌و خەڵکی بەتەنیشتی دا رەت بن وبچنە نوێژ باشە چۆن محمد بینتە دەرەوە بیبینێ لە مزگەوت نوێژی نەکردووە... یان بچنتە کوێ...

دەست نوێژم نی‌یە.. دەچمە نوێژ ئەوە تە مزگەوت دەست نوێژی شووشت و چووە مزگـەوت.. گەیشتـەرکـاتی دووەمی نوێـژەکە.. پاش نوێژە کە مامۆستایەك مایکرۆفۆنەکەی گرتە دەست و هەستایەوە...
پاش ئەوەی سوپـاسی خوای کردو سەلامی بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ رەوانە کرد، دەمەوێ پێنج دەقیقە لەوە قتان وەرگرم.. باسی گوێ رایەلی کرد.... کە هۆیـەکە بۆ ژیانێکی بەختەوەر، گوێتان لە فەرموودەی خوای گەورە نەبووە (ومن أعرض عن ذکري فان له معیشه ضنکا) باسی ئەوەی کرد کە دەبێ مرۆ لەسەر دینی خوا راست و رێك بێت و.. ئەو سودانەی ژمارد کە مرۆڤ دەبینێ ئەگەر رووی لە خوابێ... باسی رۆزی‌و رزق کرد.. سەرم بەرز کردەوە تێی رامام ئەوەیە بۆمن گرتگە پاشان تەفیسری ئەو ئایەتەی کرد «ومن یتق الله یجعل له مخرجاً ویرزقه من حیث لایحتسب» ئامازەی

بۆئەوە کرد کە دەرگای رزق فرەوانەو زۆر جار لە خەیالی تۆدا نیە خوا رزقت بۆ دەنێری پێنج دەقەکەی تەواو کردو بەلینەکەی خۆی بەجێ هێنا....

لە دلیَ خۆم دا گووتم خۆزگە بەڵێنەکەی نەدەگەیاندە جێ چونکە قسەکانی چوونە ناو دلّم.. ئەمن لە کویێو ئەو تایەت و فەرموودانە لە کویێ.. بەراستی سەرم لیَ تێکچوو بوو خوام نەدەناسی تەنیا لەو تەنگاوییە نەبێ... سوپاس بۆ خوا کە ناسیم...

زۆر کاری لیَ کردم.. ئەمن لەلایەنی ماددیەوە رووخاوم.. ئەویش پیَی گووتم کە بەهۆی گوناحەکانمە.... بیَ ئاگایی خۆم وەبیرکەوتەوە چاوەکانم ئاویان کردوو.. هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.. لە مزگەوت چوومەدەرەوە... ئەوەتانی (محمد).. چوینە ماڵەکەی بەراستی ئەوە برادەری تەواوە.. بەخێرهاتنی گەرمی کردم لە کاتێك دا ئەوانەی دەورم هەموویان دوورکەوتنەوە.. مندالّەکانت چۆنن.. حالت چۆنە.... دەنك و باست چییە...؟

★ کاکە محمد یەلەمەکە هەموو شتێکیت بۆ دەگێرمەوە.. زۆرم قسە کرد بە دوور درێژی هەموو شتێکم گێرایەوە.. پاش تەواو بوونم... وەلامێکی دامەوە کە لەژیانم یەکەم جارە گوێم لیَ بیَ.. ئەوەرە حەمەتی خوایە بۆت..

حەرامت زیاتر خواردوە لە حەلالّ تەرکەئانییەکانت واز لیَ هێناوە لە خوا دوور کەوتیەوە.. بەڵکو ئەو رووداوە دلّت بە ئاگابێنێتەوە.. بابزانی ماددە شتێك نیە.. بەڵکو خوا حیسابت لەگەلّ دا دەکا هەروەك و لەفەرموودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دا هاتووە مرۆ لە چوار شت پرسیاری لیَ دەکریَ تەمەنی بەچی بەسەربرد، گەنجا تیەکەی لەچی سەرف کرد ماڵەکەت چۆن پەیدا کردو چۆنی سەرفی کرد، ئەو زانیاریەی هەیبوو چەند کاری پیَ کرد بەلاّم سوپاس بۆ خوای گەورە...

قەرزەکانت چەندی‌ماون... ئەوەی ماوە لەسەر من دەیدەمەوە.. ئەو خانووەی ئەنیشتمان هی‌منەر پێنج ساڵ دەبێ کریومە ئەوە دوو مانگە کرێ چی بەجێی هێشتوەو ئێستا بە تاڵە... سوێندی خوارد دەبێ بێخمە ناوی تا خوا دەرگایەکم لێ دەکاتەوە.. خوا حافیزم لێ کردو لە باوەشم گرت..

رۆژی حەفتەیەك بومە هاوسێ‌ی (محمد) هەموو دوو شەممان لەگەڵ چەند برایەکی تر دەرس و دانیشتنیان هەبوو.. کتێبی ئانینیان دەخوێندەوە.. منداڵەکانم لەگەڵ منالانی ئەودا دەستیان بە قورئان لە بەرکردن کرد لە مزگەوت دا... هەستم بە نامی ژیان کرد.. کارم بەرەو چاکی بوو... لەوەشیان گرنگتر دینەکەم ماڵەکەم بوو... لە دوای نوێژی بەیانیانی لە مزگەوت دادەنیشتم تاوەك و رۆژ هەلات...
رۆژی ئیمان لەدڵم دا زەردەی دا......



## کۆتایی

ئەگــەر بەمــردن دەســتــمــان لێ بشــۆن
بێگــومــان مەرگ راحــەتــی گیــانــە
بەڵام دوای مردن حیســاب وحــەشرە
گیــان پڕ ئازارو حال پەرێــشــانــە

---

باشم نەدەنــاسی.. جاروبــار لە مزگەوتێم دەدی.. زۆربەی جاریش ئەم دەدیت.. بەگــەرمی سەلامم لێ دەکرد و بە پەرۆشی ناسین و قسەلەگەڵ کردنی بووم..

ئەو هەڵەم بۆرەخسا..

لە نوێژی عەسر بووینەوە چوینە دەرەوە.. من و هاورێیەکم لە دەرەوەی مزگەوت وەستاین و قسەمان دەکرد.. بەرەولامان هات.. سەلامی لە هاو رێکــەم کرد پاشــانیش سەلامی لەمن کرد.. لەوەدەچوو پێشتر یەکتری بناسن.. هاورێ خوێندن بوون.. قسەمان لەگەڵ یەکتریدا کردو داوام لێکردن بەلێنم بدەنێ لە ماڵەوە سەرێکم لێبدەن.. رازی بوون و رێکەوتین بەیانی دوای نوێژی عەسر لە ماڵەوە چاوەرێیان بکەم..

لە هاورێکەم پرسی گووتی: مرۆیەکە چاوەرێی چاکەی زۆری لێدەکرێ.. پرسیــاری ئەوەم لێکــرد هۆی چیــیە کەم لە مزگەوت دەیبینم.. گووتی: دۆستی خراپی هەیە لە کارو کاسبی لەگەلی دان کاتێك لای ئەوانە واز لە مزگەوت دێنێ‌و ئامادەی نوێژەکان نابێ‌و سەفەر زۆر دەکات..

باسی باشتــرین رێگــەمــان کرد چۆن لەو برادەرە خراپــانەی دوور بخەینەوە.. هاورێکەم دڵنیا کردو پێم گووت هەولدەدەم بە گوێرەی توانا

دووری بکەمەوە.. لە خوا بپارێوە لەسەر ئەوە پشتم بگرێو پاداشم بۆ حیساب بکات.. خۆم بۆ ئەوکاتی عەسرە ئامادە کردو زۆر خۆشحاڵ بووم پێی.. بەڵکو خوا لە سەر دەستی من ڕێنمایی دەکات..

بە هەندێ هاورێم ڕاگەیاند کە دەمانەوێ لەو برادەرە خراپانەی دووربخەینەوە دەبێ لەمەش هەموومان هاوکاری بکەین و لە کاتی خۆی دا هاتن ئەوەی دەمویست بوو، پیاوێکە حەزی لە چاکەیە و لەدڵان دا جێگەی خۆی دەکاتەوە.

قسەکانمان بۆ زۆر لایان پەلیان هاویشت، هەندێ لە باسەکەمان لە بارەی ئاوو هەوا بوو کە ئەورۆژانە بارانەو لە فلانە شوێن بەهارەو زەوی سەوز هەڵگەڕاوە.. هەموومان لەو گفتوگۆیە بەشدار بووین دیاربوو شارەزاییەکی چاکی لە شوێنە خۆش و سەوزەکان هەبوو کە دیمەنێکی دڵرفێنیان هەبوو. ئاماژەی بۆ شوێنێك کرد کە لیمەرانەو بەگیایەکی سەوز داپۆشراوە لە نێو ئەو گردۆلکە لمانەش جۆگە ئاوێکی لێیە.. پێك هاتین کەلە کۆتایی هەفتە بچینە ئەو شوێنە خۆشە.

سوریش بوو لە سەر ئەوەی دەبێ میوانی ئەو بین بەڵام ڕەتمان کردەوە گوتمان ئەوەندە بەسە کە تۆ خاوەن فیکرەو شارەزای ڕێگەکەشی.. لە پاش راوێژکردن لەسەفەرە کە هەمووومان بەشداربووین تەنیا فکرەکە ئەو خۆی خاوەنی بوو.

ئاوو هەوایەکی بەهاری ڕازاوە.. مێرگێك لە هەموو لایەك لە لیم دەورە درلوە.. ئەوا باخچەیەش لە نێو ئەو لیمەدابوو. بەڕاستی جوانترین شوێن بوو..

ئەو پیاوەش وای لێهات خۆشەویستی ئێمە لە دڵدا چەکەرەی کرد.. لە نێوانمان دا تەبایی و خۆشەویستی ڕەگی داکوتا.. بەتایبەتی سەفەر کردنیش بۆ شوێنی دوور زیاترت لە یەکتری نزیك دەکاتەوە..

ئەو دۆستـایـەتیـەمـان ماوەیەکی باشی خایاند وای لێ هاتبوو چونە دەرەوەمان بەبێ سێ و دوو بوو لە کۆتایی هەموو هەفتەیەك ببووە بیشە.
خشتـەیـەکی رێك و پێکمان بۆ ئەو رۆژە دانابوو سودمان لەکاتەکە دەبینی.. چ بە وەرزش وەیا کاتی حەسانەوە.. لە دوای نوێژی بەیانیان و عەسرانیش دەرسێکی کورتمان هەبوو.. بۆ منیش ئەو دەرچوونە ناخۆش بوو چونکە کاری ترم هەبوو..
ئەوکاتە بۆمن کاتی خوێندنەوەو نوسین بوو.. سەرباری ئەوەی زۆربەی کارەکانی ماڵەوەم واز لێ هێنابوو.. ئەو هاورێیەمان وای لێ هاتبوو هەموو نوێـژەکـانی دەکرد وە بەردەوام نوێژەکانی لە مزگەوت بوو هەتا نوێژی بەیانیش مۆرکی چاکی و رێك و پێکی لێ وەدیار کەوتبوو..
ئەو پەیـوەندیـیە تایبەتەی من لەگەڵم دا هەبوو هەڵێك بوو بۆ نزیك بوونـەوەو زۆربـەی دەردو ناخـۆشیـەکـانی پێشتـرو قۆناغەکانی سەر لێشێواوی بۆ دەدرکاندم.
بە هەتیـوی لە ماڵی باپیری گەورە بووە. ئەو پەیوەندیەمان دوومانگ درێژەی کێشا.. لە پاشان قەدەری خواوا بوو ماڵەکەم بۆ شوێنێکی تری دەرەوەی شار بگـۆزمـەوە چونکـە کارەکـەم لەوێ بوو.. سەفەرەکانمان برانەوە.. هەتا بە تەلەفۆنیش پەیوەندیمان نەبوو چونکە ئەمن تەلەفۆنم نەبوو..
ماوەیـەك کە زۆر درێژ نەبوو لەگەڵ ئەو پیاوە لە یەکتری دابراین کە بە تەلفۆنیش دەمپرسی دەیانگووت لە ماڵەوە نی یە..
پاکی و بێ خەوشی بۆ کەسێکـە کە هەموو شتێك لە دەست خۆیەتی.
هەندێ لەو هاورێیانەی کاتی خۆی لەگەڵمان بوون پێیان راگەیاندم کە بولای برادەرە خراپەکانی گەراوەتە.. وەك و جاران لە خوای گەورە دوور کەوتـوتەوە.. زۆربەی کاتەکانی بەسەفەر دەباتە سەرو.. ماڵ و خێزانی وازلێ هێناوە ناچێتە نوێژو بەرەو دوا وەگەراوەتەوە.. خەدوی خۆی خستۆتە

سەر گۆرانیو، وازی لە قورئـان لەبـەرکردن هێناوە.. وازی لە هاورێ چاکەکان و کتێبە بەنرخەکان هێناوە..

ئاخ و حەسرەتم بۆ هەڵکێشا بۆ خۆم و ئەویش لە خواپارامەوە.. هانی هەنـدێ برام دا تا وەك و سەفـەرەکانی زەمانی خۆی بگێڕنەوە.. دوای ماوەیەك هاورێیەك کە دەنگەکەی گۆڕابوو تەلەفۆنی بۆکردم.. کە فلانە کەس نەمری خوای بەجێ هێناو مرد..

انالله واناالیه راجعون

چ رووی‌داوە ماوەیەکە نەمبینیو زۆرم پەیوەندی پێکرد لە ماڵەوەش نەبوو.. گوتیان لەگەڵ برادەرە خراپەکانی بۆ رۆژهەلاتی ئاسیا سەفەری کردبوو بڕێکی زۆری لە ماددەی سەرخۆشکەر خواردبوو..

هەر لەوێ مردبـوو لە ناو تابـووتێکیان نابوو بە فڕۆکە گەڕاندیانەوە راپۆرتێکیان لەگەڵ دا رەوان کردبوو کەتێ‌ی دا دیاری کرابوو مردنەکەی بەهۆیِ مەوادی سەر خۆشکەر بووە.

ترسام.. زۆر ترسام لەو کۆتایی خراپەی وە دڵنیابووم لەوەی کە دڵ لە نێودوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای میهرەبانە چۆنی بوێ وای لێ دەکات..

لەسەر تۆبەکەی بەردەوام نەبوو..

بەڵکو گەڕایەوە سەرکردەوەی جارانی

انالله وانا الیە راجعون.

لە ژیانی دا لە خراپە بۆ چاکە گۆڕا

پاشان گەڕایەوە سەر خراپە کۆتایی بەو خراپەیە هات کەس و کاری گوتیان.

خۆزگە، بەهەر شتێك دەمرد.. نەك و ئەو مردنەو ئەو راپۆرتە دەستم بۆ ئاسمان بەرزکردەوە هەر بەدڵ لە خوا پارامەوە

«یا مقلب القلوب والابصار ثبت قلبي علیٰ دینك»

# بەختەوەری

**کومەڵـــی چاکـت بەدونـیـا بزیو**
**هەرگـیـز نەتـرسـانی لە دەستی قەدەر**
**بەکـرِی شەوان هەڵخـبەڵەتـاوی**
**لە شەوی سافـە گۆبـەنـدو کەسـەر**

لە دوای ئەوەی خوێنـدنی دواناوەندیم تەواو کرد.. ئەوراقم پێش کەشی زانکۆ کرد..

بەڵام شتێکی تازە هاتە پێشەوە

لاوێك کە لە ئەمریکای دەخوێند هاتە خوازبێنیم.. **هەموو لایەك ڕازی** بوون..

★ دەبێ بۆ وولاتی غەریباتی سەفەر بکەم.. گەلێك بەوە **دڵخۆش بووم..** **لە** ئەمریکا دەژیم..

ئەوەی سەیرم پێ دەهات.. چۆن کەس و کارم ئاوا بە **خێرایی ڕازی بوون** بۆ غەریبـاتی و ئەو شوێنە دوورە لە کاتێکدا **ئەو پیاوەشیان نەدەناسی و** ئەمنیش هێشتا لەو تەمەنەم..

وەك و دەڵێن مانگی هەنگوینیم بەسەر برد.. لە ساڵی تازەمان لە ئەمریکا سەقـامگیربووم.. ڕۆژانی خۆشی و شادی بەسەر چوون.. زۆربەی هەرە زوری شوێنەکانی ئەمریکام بینی.. مێردەکەشم زیاتر سور بوو لەسەر ئەوەی زۆربەی شوێنان ببینم.. تا وەك و لەسەر هەمو و شتێك زانیاریم هەبێ..

بەڵام ئەو ڕۆژە خۆشانە زۆری نەخایاند.. بە گوێرەی بۆچوونی ئێستام.. لە قۆناخی هەرزەکاری عەقلیدا بووم.. ژیانمان خۆشو و ناخۆشی تێکەوت گوێمـان نەدایە هیچ شتێك تاکو نوێژەکانیش.. تاکە شتێك کەلەسەری

..موور بووین.. ئەوە بوو کە زانیاریمان دەربارەی هەموو شتێك هەبێت، لەبەر ئەوەش لە ماڵەوە تەنها نەبووین.. زۆربەی کاتی خۆی لەدەرەوە بەسەر دەبرد بە تایبەتی لەشەواندا..

لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا منداڵمان نەبوو. لەوانەیە ئەوەش زیاتر یارمەتی نائەبابیەکەی دابێ زۆر جار دەگەیشتینە سەر لێواری کۆتایی.. کۆتایی ژیانی ژن و مێردایەتی..

ئەو حاڵەتە بەردەوام بوو..

کاتێك گەراینەوە وولات.. کەس و کارم هەستیان بە لاوازی و شەکەتیم کرد. بریارمدا بە راشکاوی قسان بۆ دایکم بکەم.

ئەویش بەش بە حاڵی خۆی هەمووی بۆ باوکم گێرایەوە.

باوکم منی جیاکردەوە. پرسیاری زۆرو وردی لێ پرسیم هەمووشی سەبارەت بە مێردەکەمو چۆنیەتی مامەڵەکردنی بوو لە گەڵدا..

دوایش تا چ رادەیەك رێك و دووستە..

لە دوای ئەوەی باوکم ماوەیەك مۆڵەتی دام بۆ بیرکردنەوە.. داوای تەڵاقم کرد.. وام دەزانی کارەکە گەلێك سانایە.. بە تایبەتی ئێمە لە ئەمریکا چەند جارێك لەسەر ئەمە پێك هاتبووین بەڵام مێردەکەم تەڵاقی رەفز کردەوەو مەرجی زۆری بۆ دانام.

لە هەموویان ساناتر.. هەموو مارەیی بۆ بگێرمەوە.. پاش هێنان و بردنێکی زۆر رۆژە ناخۆشەکان بەسەر چوون.. ئەوەی وای لێکردم زیاترم رق لێ بێ تەوە داواکاریەکانی تەڵاق دانی بوو.. لە گەڵ ئەوەش دا کە لە کاتی خوێندنی یارمەتیەکی زۆرم دابوو. ئەو پارەیەی لام بوو هەموویم داێ..

ئەو ساڵان مانگانەی منی لەبەر دەستابوو.. هەر چۆنێك بێت ئەوەی ئازادی وەری گرت و ئەوەی ویستم وەرم گرت.. گەرامەوە سەر ژیانی جارانم.. وەکو ئەوەی خەونیشم نەدیبێ و ئەو مۆتەکە ناخۆشەش

سواری سەر سەرم نەبووبێ..

★ لە گەڵ دەست پێکردنەوەی خوێندنی زانکۆ..

ئەوراق و بڕوانامەی کۆنم کۆ کردەوە.. پێشکەشی زانکۆم کرد حەزم کرد بچمە بەشی زمانی ئینگلیزی.. لەبەر ئەوەی ئەو ساڵانەی لە دەرەوە بووم باش فێری ببووم..

بەڵام خوا وای حەز لێبوو گەیشمە دەستەخوشکێکی زەمانی دواناوەندیم لە دوای چاك و چۆنیەکی گەرم و.. پرسیار کردن.. پێم گووت ئەوە بە تەمام بچمە بەشی زمانی ئینگلیزی.. ئەو دەستە خوشکەم یەك ساڵی مابوو خوێندن تەواو بکات.. لەبەشی دراساتی ئیسلامی دەیخوێند..

لەو وەستانە کەمە توانی ڕازیم بکات بچمە بەشی دراساتی ئیسلامی..

بۆی باس کردم کە زانیاری باشی لێیە سوودی لێ وەردەگرم.. وە بەهەسور قوتابیانی بەشەکەم دەناسێنێ چونکە ئەو دەیاننناسێ.. هەروەکو چالاکی دوور لە پەیڕەوی خوێندنی زۆرە.. وەکو کۆڕو کۆبوونەوەی جۆراو جۆر.. ئەو لایەنە.. منی بۆ قۆناغی منالی گەڕاندەوە کە حەزم لەو جۆرە چالاکیانە بوو..

هەر وەکو ئەو پێی گوتم دوو دڵ مەبە منیش پشتم بە خوا بەستا...زۆر بە خێرایی بوومە ئەندامێکی چوست و چالاکی ئەو بەشە کە خۆشم لەو باوەڕە نەبووم .. بەشداری کۆڕم دەکردو ڕێکم دەخست.. هەروەها ئەو کۆمەڵەی لە گەڵدا بوون زۆر ڕوح سوك و دڵخۆش کەربوون.. ئەوەبوو کە سێ ساڵ بوو من ونم کردبوو.. گەڕامەوە سەر لەش ساغی جارانم.. ڕەونەقی ژیان کەوتە چاوانم.. هەروەکو دایکم هەموو جارێك وای دەگووت.

★ هەروەکو دەڵێن کاتم نەبوو.

خەریکی لێکۆڵینەوەبووم.. وەیان بەدەرسەکانم دا دەچوومەوە.. جاریش

هەبوو خەریکی ئامادەکردنی سیمینارێکی دە رەقیقەیی بووم بۆ ئەوەی بۆ دەستەخوشکەکانمی بخوێنمەوە..

بە هیمەتێکی توند و بە ڕاستی چوومە ناو کارەکە.. ئەو دەروبەرەی لێی دەژیام وای لێکردم فەرزەکانم لەیاد نەکەم.. بەڵکو سونەتەکانیشم دەکردن لە نوێژ و ڕۆژی.. سوپاسی خوام کرد کە کاری ئاسان کردم بچمە ئەو بەشەو ببمە هاوڕێی چاکان..

لەگەڵ دەستەیەک لە هاورێکانم بریارماندا قورئان لەبەربکەین..
لەلای من ئەو بریارە.. مانای وایە پێش وازی قۆناخێکی تازە دەکەم..

دەستمان بە قورئان لەبەرکردن کرد..لەسەرەتا لەوە دەترسام نەتوانم بەردەوام بم بەلاَم خوای گەورە بەردەوامی دامێو یاریدەی دام بۆ ئەوەی بەبێ ماندوو بوون لەبەری بکەم هەروەها ئەوەی لەدەستم چووبوو لە عەقیدەو فقهـ سەر لەنوێ گرنکیم پێدا..

سبحان الله کاتێ سەفەری ئەمریکام کرد وام دەزانی لەو پەری بەختەوەریم.. بەلاَم تێگەیشتم دووری لەخوا هەرگیز بەختەوەری تێدانییە.. ئەگەر لە ڕواڵەتیش شێوە بەختەوەریەکی پێوە دیاربێ.

★ چالاکیەکانم ڕەگی بۆ ماڵەوەش کێشا.. خوشکیشم لە گەڵ من دا دەستی دایە قورئان لەبەرکردن.. برێکم لە کاتی خۆم تەرخان کرد.. تا ئەو شتانە بۆ دایکم بخوێنمەوە پێویستی پێیە.. بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە.. سوپاسی خوام کرد کاسێتی ئیسلامی لە ماڵەکەمان لە زیادی بوو.. دەچوومە هەر ماڵێك کۆمەڵێکم بە دیاری دەبرد. نەم دەهێشت بۆنەیەك بەبێ سوود بڕوات.

ژیانم هەمووی گۆڕا.. بە شێوەیەکی تازە دەمڕوانیە دونیا.. کە شوێنی تێبەڕینە.. نەك شوێنی مانەوە..
هیچ شتێ ژیانی نەشێواندم تەنیا گەڕانەوەی مێردەکەی پێشوٗوم نەبێ لە ئەمریکا پاش ئەوەی خوێندنی تەواو کرد.
دایکی هاتە لامان داوای لێ بووردن و لەبیر چوونەوەی رابردوو گەڕانەوەی لای مێردی پێشووی دەکرد.. سەرم ماچ کردو پێم گووت من هەموو رابردووم لەبیرچوٗتەوە.. لێی خۆش بووم داوا دەکەم خوا لێم خۆش بێ، داواکەم ڕەت کردەوە بەڵام لەبەڕێ کردندا کۆمەڵە کاسێتێکم بە دیاری بۆ نارد.. کە هانی تۆبە کردن و حیساب لە گەڵ خۆداکردنی دەدا.. پێشم گووت هیچ کاتێکم نی‌یە بە تەنیا خەریکی خوێندنم..
ئەوەشم لەبیر نەبوو پێتان بڵێم زۆرانم هاتنە خوازبێنی.. لەهەموویان گرنگتر بەلای من برای دەستە خوشکێکم بوو..
ڕەتم کردەوەو گووتم بەڵێنم بە خوا داوە تا وەك و هەموو قورئان لەبەر نەکەم مێرد نەکەم.. هەوڵی دا ڕازیم کات.. بەڵام گووتم ئەوە دوا ساڵی زانکۆمە.. هەر وەها دوا ساڵە بۆ قورئان لەبەر کردن.. بێ دەنگ و بێ وەڵام بوو..
لە دوایی ساڵێکی تەواو.. خوێندنی زانکۆم تەواو کرد.. حەزم دەکرد بگەڕێمەوە لە زانکۆ دابمەزرێم.. بەڵام خوا شتێکی تری حەز کرد..

لە قوتابخانەیەکی نزیك ماڵی خۆمان دامەزرام.. چالاکی دوور لە دەرسەکانی قوتابخانەم بەردەوام بوو.. خشتەیەکی تایبەتیم بەو سیمینارانە دانا کە قوتابیەکان ئامادەیان دەکرد.. هەر وەك چالاکی تایبەتیشم بە قورئان لەبەرکردن دانا.

کارەکان شێوەیەکی دڵخۆشکەریان وەرگرت.. وەك یەك خێزانمان لێهاتبوو..

ئێـوارەی ئەو ڕۆژە.. دەستـە خوشکـەکەم سەری لێدام.. ئەمن بەلێنی مێردکردنم پێدابوو پاش قورئان لەبەرکردن..
ئێستا هیچ بیانوێکت نەماوە..
ڕازی بوو.. هەموو شتێك بە پێی سوننەت بەڕێوەچوو.. بێ ماڵ بەفیڕۆ دان و ئاهەنگ گێڕان..
باشترین پیاو پیاوی دین و شەو نوێژە و ڕەوشت بەرزە..
لێم مەپرسن چۆنی لە گەڵدا ژیام.. هەروەك و ساڵەها بێ لە چاوەڕێی یەکتری دابووبین..
گوتی ئەوەی زیاتر سوری کردم لەسەر خواستنت.. سوربونم بوو لەسەر قورئان لەبەرکردن..
سوپـاس بۆ ئەوە خوایـەی کە حاڵان دەگۆڕی.. لە ئەمریکاو.. زانیاری لەسەر هەموو شتێك بۆ قورئان لەبەر کردن..
سوپـاس بۆ ئەو خواییـەی بەبـەر ڕەحمـەتی خۆی خستم پێش ئەوەی لەدەستم بچێ.



# دڵ...

ئیستاش لەبیرمە کە منداڵ بووم..
بە هۆی ئەوەی دووچاری سەرمابووم بۆ حەفتەیەك لە نەخۆشخانە مامەوە.. کاتی دەرچوونم ئاگام لێبوو دکتۆرەکە بە باوکمی ڕاگەیاند کە ئێستا کە تەندروستیم چاکە بەڵام ئەو نەخۆشیە لە داهاتوودا ئەسەری دەبێ.
ساڵانی دووردرێژ بەسەر چوون. بوومە گەنج و پاشان باوك زۆر جاران بە هۆی کارێکی کەمەوە هەستم بە ماندوویی و شەکەتی دەکرد...
چوومە نەخۆشخانە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی هەموو تاقیکردنەوەکان بکەم.. دەرچوو زمانەکانی (صمام) دڵم لاوازن. پێویستە عەمەلیاتێکی دڵم بۆ بکەن.
ئەو لاوازیەش دەگەڕێتەوە ئەو ماوەی پێشوو کە دووچاری سەرما ببووم کە ببووە هۆی ڕۆماتیزمی دڵ.. هەوڵم دا دکتۆرەکە چارەسەری وەیا حەسانەوە ڕازی کەم.. لە جیاتی عەمەلیاتەکە بەڵام پێی ڕاگەیاندم..
★ پاش چەند مانگێکی تر پێویستت بەو عەمەلیاتە دەبێ.. خۆشت ئەوەت بۆ دەردەکەوێ.. بە حەق پاش چەند مانگێك.. دووچاری لاوازی بووم و شەکەتیم پێوە دیاربوو..
بڕیارم دا بە قەزاو قەدری خوا ڕازی بم و خۆم تەسلیمی خوا بکەم.. پاش تاقیکردنەوەی گشتی و وەهەموو پێویستیەکانی دوای ئەویش.. بەڵێنی ئەوەم وەرگرت ئامادەی نەخۆشخانەبم تا پێش عەمەلیاتەکە ماوەیەك بمێنمەوە.. ئەوەش بوو..
لە ڕۆژی یەکەم خزم و کەس و کار سەریان لێ دام.. دڵخۆش و دڵنیا بووم.. زیاتر لە سەعاتێك لە گەڵ ئەو دکتۆرە دانیشتم کە عەمەلیاتەکەم بۆ دەکا، لەو شەوەی کە پێش مەوعیدی عەمەلیاتەکە بوو.. بە هێمنی نوستم.. هەرگیز بیرم لە شتێ نەدەکردەوە.. لەگەل بانگی بەیانی لە خەو ڕابووم.. گوێم لە دەنگی بانگ بوو، لە ناخم دا دەنگی دایەوە.. هەژاندمی.. شتێکم

هاتە خەیاڵ.. ئەو هێمنیەم گۆڕا.. نازانم چیم لێقەوما. عەمەلیات شتێکی گرانە. لەوانەیە ئەوەدوا رۆژی ژیانت بێ. لەوانەیە ئەوە دوا بانگ بێ لە ژیانت گوێت لێ دەبێ.. خەیاڵم بۆ هەموو لایەك دەرۆیشت.. ئەو ماوەی رۆیشت لە کوێ بوی..
پرسیارێك بوو فرمێسکی لە چاوان باراندم. ژیانی رابردووم وەك و خەون تیپەری.. بۆ بیرم لە ئاخیرەت نەدەکردەوە.. ئەوەتانێ مەرگ نزیك کەوتەوە..
کاتێ سەری خۆم بەرز کردەوە.. ئەوە برینی پێچەکەیە لەسەر سەرم وەستاوە..
چیتە..
وەرامم نەدایەوە
بەلام تێبینی پشێوی و نیگەرانی لێکردم .. لەوانەشە خۆی پێشبینی ئەوەی کردبێ دەرزیەکی خەوتنی لە دەستابوو. دەستی خۆم بۆ راکێشا..
دەزانم دڵی خۆم دەدەمە دەستی نەشتەرگەر..
لەپێش ئەوەشدا.. خۆم دایە دەستی خوا.. سنگم شەق دەکرێ.. لەماوەی ئەو عەمەلیاتە دڵیشم لە لێدان دەکەوێت.. لە دوای تەواو بوونی عەمەلیاتەکە. بارگەیەکی کارەبایی دەدرێتێ بۆ چالاك کردنەوەی دڵ و لێدانی سەر لەنوێ.. ئەگەر وەلامی نەبوو نەکەوتەوە کار..
ئەوە جارێکی تریش بارگەی کارەبایی دەدرێتێ.. لە دوای ئەوەش لەسەر دارەبازە هەڵم دەگرن.. ئەو زانیارانەی دەمزانی ژیانی لەلا سوك و ئاسان کردبووم.. باشە چۆن عومری خۆم بەبادادا..
چەند چرکەیەك پاش دەرزیەکە بێ هۆش بووم. پاشان زانیم دکتۆری نەشتەرگەر هەشت سەعاتی بێ پسانەوە لە دڵم دا کاری کردبوو.. سوپاسی خوام کرد کە دڵم لەگەڵ یەکەم بارگەی کارەبا کەوتبووە کار..
★ لە دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچووم.. هەموو رۆژێك بە رۆژانی رابردووم دا دەچوومەوە..
ئەوسا ئەوم دەهاتەوە یاد کە لەسەر نوێتی مردن بووم فرمێسکم لە چاوان بە کور دادەباری چۆن بچمە بەردەستی خوا.. بەچی.. هەر چەندە ئەو ساتانەم وەبیر دەهاتەوە. زیاتر گوێرایەڵ لەو لە خوا نزیکتر دەکەوتمەوە.
هەر چەنە نەفس بەرەو کەم و کورتی و تەمەڵی دەمبردم..ئەو هەڵوێستەم بیر دەکەوتەوە..
سوپاسی خوام کرد کە جارێکی تریش بۆ ژیان گەرامەوە..